چیرۆك بۆ منداڵان

# مرۆڤی گێل خواردەی گورگی لەڕە!

حاجی مەمۆ





بەدرخان
Bedirxan

خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرس
حەمید ئەبوبەکر بەدرخان

پڕۆژەی چاپکردنی کتێبی منداڵان :
بەسەرپەرشتی محەمەد فەتاح

ناوی کتێب: مرۆڤی گێل خواردەی گورگی لەڕە!
نوسینی : حاجی مەمۆ
وێنە: محەمەد فەتاح
نەخشەسازی: محەمەد بەردەسپی
فەرزومونتاژ : نوسینگەی هیلی شین
نرخ : ١٥٠٠دینار
تیراژ: ١٥٠٠دانە
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
شوێن و ساڵی چاپ: هەولێر ٢٠٠٩
ژمارەی سپاردن: ١٤٧٦ ساڵی ٢٠٠٩
چاپ: چاپخانەی کاروان / هەولێر
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان

دەگێرنەوە، شوانێك لە گوندێكی ئەم كوردستانەدا دەژیا، بەدەم شوانی كردن، ژیانی ئاسایی خۆی بەسەردەبرد. شەوێكیان شوانە خەونی دیت، لەو خەونەدا، مرۆڤێكی فریشتە ئاسا، كە بەرگێكی سپی لەبەربوو، هاتە سەردانی و پێكەوە كەوتنە یەكتری دواندن. مرۆڤەكە زۆر بە میهرەبانی وەڵامی شوانەی دایەوە، تاكو شوانە كەوتە گل و گازاندە لە بەختی خۆی. پیاو چاكەكە پێی گوت:

– واچاكە بۆ خۆت سەفەر بكەی، بەگوند و شاراندا بگەڕێی، لەو سەفەرە بەختت دەكرێتەوە، تەمی ئاسمانی ژیانت دەڕەوێتەوە، سامانەكی زۆرت دێتە پێش و ڕەنگبێ ببی بە یەكێ لە زەنگینەكانی ئەم زەمانە!

بۆ بەیانی كە شوانە لە خەو ڕابوو، بەبێ یەكو دوو كردن، وازی لە شوانی كردن هێنا، گوندی بەجێ هێشت ، ڕێگای سەفەری گرت، زۆر دوور ڕۆیشت، تاكو لە دەشتێكدا توشی گورگێكی لەڕ بوو، گورگە بەهۆی لەڕو لاوازی، لەو دەشتە لە پەل و پۆ كەوتبوو، برسی و نەخۆش بوو، كە چاوی بە شوانە كەوت و لە شوانەی پرسی:

– ئەی مرۆڤ لە روخسارتەوە، كزو ماندوو دیاری، ئەوە بەرەو كوێ دەچی؟

شوانە هۆی خەمباری خۆی بۆ گورگە گێڕایەوە و (خدری زندە) هاتۆتە خەونی و ئامۆژگاری كردووە كە ئەگەر سەفەر بە گوند و شاراندا بكات، بەختی دەكرێتەوە.

گورگە ئەمجارەش ڕووی لە شوانە كرد: منیش هەر وەكو تۆ بەدبەختم، ژیانم هەر ناخۆش و دەردەسەری بووە، بە خۆت دەمبینی چۆن لە برسان، لەڕو لاواز كەوتووم، بەڵكو ئەگەر ئەو مرۆڤە چاكەت دۆزیەوە، پرسیاری هۆی ئەو بەدبەختییەی منیشی لێ بكەی، تاكو لە خۆم بگەم.

شوانە گفتی بە گورگی لەرداو ملی ڕێگای خۆی گرت.

شوانە هەر ڕۆیشت و ڕۆیشت، هەتا برسیەتی تاوی بۆ هێنا، ماندوو بوون زەفەری پێ برد، گەرەكی بوو لەشوێنێك بحەسێتەوە. لەو ناوەدا دارێكی بەتەنهای دیت كە لە كەناری ڕێگایەكەوە شین ببوو، شوانە چوو لە بن سێبەری دارەكە دانیشت. سەیری كرد گەڵاكانی ئەو دارە تاك تاكەن و هەموشیان وشكو سیس بوونەتەوە. ئەوەبوو دارەكە دەنگی هەڵبڕی و وتی تۆ كێی؟ چ كارەی! ئەوە تۆش ئەی مرۆڤ بۆ وا مات و خەمگینی وەكو من؟ شوانە سەربردەی خۆی بۆ دارەكە گێڕایەوە. دارەكە بە نیگەرانیەوە وەڵامی دایەوە:

– هەردووكمان بەدبەختین، منیش وەكو تۆم، هەموو ژیانم ژان و نەگبەتییە!

شوانەکە پرسی لەبەر چی؟ خۆ تۆ وەکو من مرۆڤ نیت؟

دارەکە وەڵامی دایەوە: خۆت ئەوە من دەبینی، گەڵاکانم سیس هەڵگەڕاون لق و پۆپەکانم وشك بوونەتەوە ، لەگەڵ ئەوەش دارێکی تەمەن درێژم، ڕەگ و ڕیشەم بەناخی زەوی دا شۆڕبۆتەوە، بەڵام دارێکی ڕووت و قوتم ، تەڕ و سەوزی لێمەوە دورە، کەچی ئەو دارانەی زۆر لە من کەم تەمەنترن، تا بڵێی دڵشادو گەڵا سەوزن، بەردەوام لە گەشەکردن دان. بۆیە تکات لێ دەکەم، ئەی شوانەی هەژار، بزانە هۆی بەدبەختی من و ئەو نەگبەتیەی توشم هاتووە چیە؟ ئەگەر وەڵامەکەم بۆ بهێنیەوە هەتا مردن لە چاکەت دەرناچم.

شوانە گفتی بەدارەکەش داو سەر لەنوێ کەوتەوە ڕێگا، هەتا بەرە بەری تاریك بوونی دنیا ڕۆیشت. ئەو دەمە گەیشتبووە کەناری گوندەکی پڕ باغ و باغات، هەر لەکەناری گوندەکە لایدایە بەر دەرگای ماڵێك کە بەتەنیا لەو ناوە بوو، جوتیاری خاوەن ماڵ دەرگای کردەوە: فەرموو میوان بەخێر بێ ی سەر سەرمان.

شوانە و خاوەن ماڵ بەیەکەوە چونە ژورەوە و هەموو خێزانەکە بەخێرهاتنێکی گەرمیان کرد و ئەو خۆراکەی هەیانبوو لە بەردەمیان دانا، شوانە تێر بەسکی خۆی خواردی و پشویەکی حەسانەوەی هاتەوە بەر . دوایی جوتیاری خاوەن ماڵ لە شوانەی پرسی:

- کاکی برا تۆ چ کارەی؟ سەفەرت بەرەو کوێیە؟

کە شوانە چیرۆکەکەی خۆی بۆ جوتیارەکە گێڕایەوە، مامەی جوتیار هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی:

سەر بردەی تۆش هەر لە ژیانی پڕ بەدبەختی من دەکات!

- شوانەکە پرسی، ئەوجا دەبێ تۆ بۆ ئاوا بەدبەخت بیت!

جوتیارەکە: کاکەی شوان هەروەك خۆت دەزانی. جوتیار لەسەر بەروبوومی ئەو پارچە زەوییە دەژی کەخۆی ساڵ دوانزەی مانگ خەریکیەتی، دیارە ئەگەر زەویەکە بەپیت بێت، بێگومان خاو و خێزانەکەی ژیانێکی خۆش و بێ سەریەشەیان دەبێت. منیش کە پارچە زەویەکی فراوانم هەیە، لەگەڵ هەموو ماندوو بوونی ڕۆژانەم بۆ کێڵان و بەناو هێنانی، هەرچیەکی تیا دەچێنم، تەنیا ناوەندی زەویەکە دەبێتە قۆپەن و دەوروبەری زەوییەکە هیچی لێ شین نابێت! من سەرم لێی سوڕماوە و ژیانم هەمووی کوێرەوەری و بە نەبوونی

بەسەرچووە، تکایە بۆ منیش لەو پیاو چاکە بپرسە، هۆی ئەو نهێنییەم بۆ دەربخات! هەرچیەکت گەرەك بێت پێشکەشتی دەکەم.

شوانە وەڵامی دایەوە: بەسەر سەر و سەر چاوانم.

ئەو شەوە شوانە لەماڵی ئەو جوتیارە هەژار و نەدارە خەوت ، بەیانی زوو ماڵ ئاوایی لێکردن و ڕێگای سەفەری خۆی گرت. شوانە ئەوەندەی توانی بەڕێگاوە ڕۆیشت، تاکو توشی دەروازەی شارێکی گەورەی جوان و ڕازاوە بوو. بەناو کۆڵان و جادەو دوکان و بازاڕو باخچەکاندا دەسوڕایەوە، لەناکاو یاساولەکانی کۆشکی پاشا دەورەیانداو بەرەو کۆشییان برد. شوانە بەتەنگە تاوی هۆی ئەو ڕاپێچ کردنەی لە یاساوڵەکان پرسی:

– بۆ دەمگرن کەهیچم نەکردووە؟ من هەر خەڵکی ئەم شارەش نیم!

فەرمانی پاشای شارە، هەر لایدەیەك بێتە شارەکەمان، دەبێ لە پێشا بچێتە لای پاشا بۆ هەندێ پرسیار و وەڵام، کە ئێمە خۆشمان لەو نهێنیە ناگەین. یاساوڵەکان وەڵامیان دایەوە. دوای گەیشتنە بەردەم دیوەخانی کۆشکی پاشا، شوانە سەیری کرد. ئاپۆرەی دەست و پێوەندەکان لەو ناوە دێن و دەچن، پاشا لەسەر کورسیەکی ئاودراو بە زێڕ دانیشتووە، وەزیرو گەورە پیاوەکانی شار لەم لاو ئەو لای دانیشتوون. لەبەردەمیشیان شانۆیەك هەبوو، کۆمەڵێك کیژوکاڵ خەریکی سەماکردن بوون. هەموو سەماکەرەکان بەدەم ئەو مۆسیقا و ئاوازەوە هەڵدەپەڕین و کچی شۆخ و شەنگ و هونەرمەندی میللی تێدا بەشداربوون ، کەچی لەگەڵ هەموو ئەوەشەوە پاشا تا بڵێی خەمبار و کزو مات بوو، وەك ئەوەی لەناو شەپۆلی خەم و پەژارەدا بێت!

شوانەکە ڕاست لەبەردەم پاشا وەستاو پاشا لێی پرسی:

– تۆ کێی و لەکوێ هاتوی و بۆ کوێ دەچی؟ شوانەش وەڵامی پاشای دایەوە. پاشا یەکسەر فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە و بە شوانەی گووت:

منیش وەك و تۆم، بەدبەختم ، لە هیچیشم کەم نیە. دەورو بەرم بە پیاوانی دەربار و نۆکەر گیراوە، خاوەنی خەرمانی مەرجان و یاقوتم، ئەسپ و جوانوی ڕەسەنم هەیە ، ڕۆژانە بەدوای تەواوبوونی کارەکانی بەڕێوەبردنی شارەکەم، لێرە بەدەم سەیرکردنی سەماو هەڵپەرکێی میللی کات بەسەر دەبەم. بەڵام دڵم ئاسودە نیە، هیچ چێژ و خۆشیەك لەو بەزم و ڕەزمە وەرناگرم، بە جۆرێك ئەو ژیانە بەدۆزەخ دەزانم! بۆیە شوانەی مەرد، بەڵکو

چارەیەك بۆ دەردی من لەلای ئەو پیاوە چاکە وەربگریتەوە، خوازیاری هەر جۆرە سامان و گەنجینەیەك بێت ، پێتی ببەخشم.

شوانە وەڵامی دایەوە: بەسەر سەرو چاوانم، ئەو شەوە لە خزمەت پاشا مایەوەو بەیانی ڕوخسەتی خواست و ڕێگای سەفەری خۆی گرتەوە .

شوانە ڕۆژێکی دیکەش ڕۆیشت، تاکو گەیشتە سەر کەناری ڕوبارێکی پان و بەرینی پڕاوپڕی ئاو. پاش حەسانەوەو تێر ئاو خواردنەوە، لەسەر کەناری ئاوەکە، کەوتە سەیر کردنی ڕەوتی هەڵقوڵانی سەیرو سەمەرەی ئەو ڕوبارە ، کەتاکە یەك ماسی جوان و خاڵبەند لە دوورەوە دیار بوو، ماسیەکە هەتا ئەهات لە لێوار ڕوبارەکە نزیك دەبووەوە ، شوانە فرسەتی هێناو ئەو ماسیەی ڕاو کرد . لێرەدا ماسیەکە وەك مرۆڤێکی ئاسایی کەوتە گریانێکی دڵسوتێنەر ، کە ئاگری لە دڵی شوانەکە بەرداو بە شوانەی گووت:

– ئای چەند بەدبەختم، کە دەچمە قوڵایی ناو ڕوبارەکە ، ئاژەڵە ئاوییە زلەکان پەلامارم دەدەن، گەرەکیانە قوتم بدەن !

هەرکە دێمە لێوارەکانیشەوە بۆ ئەوەی بە دیداری زەوی شاد ببم ، هەناسەیەکی سازگار هەڵمژم، ئەوە لەلایەن مرۆڤەوە ڕاو دەکرێم! ئای من گیانلەبەرێکی زۆر بەدبەختم ! نازانم چی دەبێ چارەنوسم ؟

شوانەکە کە گوێی لەو وشانەی ماسیەکە بوو، دڵی بۆ سوتاو کەوتە زیاتر دواندنی !

– کەواتە تۆش وەکو من ماندوو و لە ژیان بێزاری ، وەك من دەردت گرانە . ئیتر شوانە هەموو چیرۆکی خۆی بۆ ماسیەکە گێڕایەوە و ماسیەکە پێی گووت :–

– مادام چیرۆکی هەردوکمان لە یەك دەچن . تکات لێ دەکەم سەبارەت بەو بەدبەختیەی منیش بپرسە ، بەڵکو ئەو پیاو چاکە بۆ منیش چارەیەکی هەبێت ؟

– شوانەکە: گوتی بێگومان لە هۆی بەدبەختی تۆش پرسیار دەکەم ، هەرکە گەیشتمە سەرچاوەی وەڵامێك ، بە زوویی بۆتی دەهێنمەوە . ئەوجا شوانە ماسیەکەی فرێدایەوە ناو ئاوی ڕوبارەکەو گەرەکی بوو ڕێگای سەفەر بگرێتەوە بەر ، بەڵام خەوی ماندوو بوون ، بەسەریدا زاڵ بوو ، هەر لەوناوە لەسەر گیا و گوڵان پاڵ کەوت ، کەوتە خەوێکی ئێجگار قورسەوە ..

شوانە لە خەوە قورسەکەدا . خۆی لە ئەشکەوتێك دیتەوە ، هەمان ئەو پیاو چاکەی لێ بوو ، کە ئامۆژگاری ئەو سەفەرەی بۆ کردبوو ، تاکو گرێ کوێرەی بەختی بکرێتەوە .

پیاوەکە بە میهرەبانی ڕووی لە شوانە کرد و گووتی :

– شـوانە تەماشـای بنـە بـانی ئەشـکەوتەکە بکـە . هەنوکـە دەبـینی کانییـەکی لـێ هەڵدەقوڵێ ئاوی سازگاری لێ دێتە دەرەوە . پیاوچاکەکە بەو گۆپاڵەی بە دەستیەوە بوو . کونێکی لەبنەبانی شاخەکە کرد و یەکسەر ئاو لەو کانیە هەڵقوڵا . پیاوەکە دیسانەوە ڕووی لە شوانە کرد :

تۆش لە کۆتایی ئەم سەفەرەدا ، وەك هەڵقوڵانی ئاوی ئەو کانیە ، بەختت دەکرێتەوە ، لە هەموو لایەك دەست کەوتی ژیان چاوەڕوانت دەکات ، ئەگەر دەتەوێ شادومان بژی، بە چ ڕێگایەکدا هاتووی ، بە هەمان ڕێگا بگەڕێوە گوندەکەی خۆت و بە ئارەزوی دڵت دەتوانی دەوڵەمەند بیت !

شوانەکە بەم مژدەیە زۆر شادومان بوو ، بەڵام پرسیار و خۆزگەی ئەوانەشی لەبیر نەکرد کە لـە ڕێگـادا بینیـوونی و گفـتی پێـدابوون لـە گەڕانـەوەی دا وەڵامیـان بـۆ لـەپیاو چاکەکە وەربگرێتەوە .

شوانەکە بە پیاو چاکەکەی گووت :

– وێرای سوپاس و پێش ئەوەی ماڵ ئاوایت لێ بکـەم، دەمـەوێ وەڵامی پرسیارو هـۆی بەدبەختی ئەو پاشاو جوتیار و گورگ و ماسی و دارەشم بۆ ڕوون بکەیتەوە، تاکو لە ڕێگای وەڵامەکانی تۆ ، ئەوانیش بەختەوەر بن و بە درێژایی ژیانیان سوپاست بکەن .

پیـاوە چـاکەکە گـووتی: هـەر پرسـیارێکت هـەبێ یـەك بەیـەکیان وەڵام دەدەمـەوە، شـوانە پرسـی " دەرمـانی دەردی ئـەو گورگـە لـەڕ و نەخۆشـە چیە کـە لـەو دەشـتە کـەوتووەو هـەتا توانای ڕاو کردنی هیچ نێچیرێکی نەماوە؟

پیاو چاکەکە وەڵامی دایەوە :

– تاکە دەرمانی چاك بونـەوەی ئـەو گورگـە، خواردنی گۆشتی پیاوی گێلە کە هەڵکەوتی ژیان ناقۆزێتەوە و بە گەمژەیی درێژە بە ژیان دەدا .

شوانەکە گوتی : تێگەیشتم ، ئەدی هـۆی نـا ئومێدی ئەو دار چنارە چیە ؟ کە باریك و وشك ، گەڵاکانی زەرد و سیس ، هەرئەوەتە خۆی ڕاگرتووە ؟ کەچی دارەکانی لەو بچوکتر هەموو سەوز و ڕوگەشن ؟

پیاو چاکەکە وەڵامی بەو جۆرە دایەوە :

– له بن ئەو دار چنارەدا ، حەوت گۆزە زێڕی پڕاو پڕ هەن، کە ڕێگایان لە ڕەگ و ڕیشەی ئەو دارە گرتووە بۆ بەناخی زەوی گەیشتن و گەشە کردن . بۆیەش لق و پۆپەکانی وشك بونەتەوە ،گەڵاکانی سیس و زەردن، هەر کاتێك یەکێك ئەو گۆزە زێڕانە دەر بهێنێ ، ئەوە ڕەگ و ڕیشەی ئەو دارە دەگەنە ناخی زەوی و دارەکە سەر لە نوێ دەگەشێتەوە و گەڵاکانی سەوز دەبنەوە .

شوانەکە گوتی: زۆر باشە . بەڵام پێم ناڵێی هۆی بەدبەختی ئەو جوتیارە هەژارە چیە ، کە شەوو ڕۆژ بە کێڵان و بە ناوهێنانی ئەو پارچە زەویەی هەیەتی خەریکە ، کەچی ئەو بەرو بومەی کە بەدەستی دەهێنێ ، زۆر کەمەو بەشی ژیانی ناکەن ؟

پیاو چاکەکە وەڵامی دایەوە :

ئەمەش هەمان گرفتی دار چنارەکەی هەیە . لە کەنارەکانی زەوی جوتیارەکەدا، گەنجینەیەکی شاراوەی کۆنینە هەیە ، کە هەموو قوژبنەکانی ئەو زەویەی گرتۆتەوە ، بە هۆی هەبوونی ئەو گەنجینەیە لە ژێر خاکی ئەو پارچە زەویەدا ،هەرچیەکی لێ بچێنرێ ، بەرو بومێکی ئەو تۆی نابێت . کە بۆتە مایەی هەژاری و بەدبەختی ئەو جوتیارە . دیارە بە دەرهێنانیان هەم دەستکەوتێکی گەورەی بۆ دەبێ و هەمیش بۆ لەمەو دوا زەویەکەی بە پیت دەبێت .

شوانەکە گوتی ، ئەمەش لە شوێنی خۆیدا ، ئەدی هۆی نائومێدی و خەمباری ئەو پاشا گەنجە خاوەن دەسەڵاتە چیە ؟ کە سەرباری ئەو هەموو خۆشیەی بەردەستی ، ژیانی خۆی بە دۆزەخ دەزانێ ؟

پیاو چاکەکە وەڵامی دایەوە :

ئەو پاشایە ، پیاو نیە ، کچێکە هەرەتی مێرد کردنیەتی ، دیارە هەموو کچێك زیاتر لە هەمێزی مێردەکەی بەختەوەر و شادومانە . چونکە بەختەوەری ژن و مێردایەتی ، سەرپشکی هەموو جۆرە بەختەوەرییەکی دیکەیە . ژن تەنیا لە تەك مێرد و ئەو پیاوەی خۆشی دەوێ و سۆزی لەگەڵ دەگۆڕێتەوە ، هەست بەخۆشی و بەختەوەری دەکات . بەو پاشایە بڵێ ، با بۆ خۆی مێرد بکات ، تاکو بەختی بکرێتەوە و لە تارمایی خەم و پەژارە ڕزگاری ببێت .

شوانە گووتی ، فەرمودەکانت هەمووی بەجێن ، تەنیا پرسیارێکم ماوە ، کە ئەویش دەربارەی ئا ئومێدی ئەو ماسیە بچکۆلانە جوانەی کەناری ڕوبارەکەیە ؟ لە کاتێکدا نە گەورە دەبێ و نە دەتوانێ وەك گیانلەبەرەکانی دیکە ئاسودە بژی ؟

پیاو چاکەکە وەڵامی دایەوە :

لە قورگی ئەو ماسیەدا ، دوڕێکی بچوکی بە نرخ گیری خواردووە، هەر یەکێك ئەو دوڕە دەر بهێنێ ، هەم ئەو کەسە دەبێتە خاوەن سامانێکی زۆر و ، هەمیش ئەو ماسیە ڕزگاری دەبێ و تێر بە سکی خۆی دەخوات ، وەك گیانلەبەرەکانی کە شاد و گەورە دەبێ .

شوانە گوتی :

بەڕاستی تۆ مرۆڤێکی میهرەبانی ، وەڵامی نهێنی بەدبەختی هەموویانت بۆ ڕوون کردمەوە . ئیتر شوانەکە لەو خەوە بێدار بووەوە ، سەیری کرد ڕۆژ هەڵاتووە ، تێرخەو بوو، ماندوو بوونی نەماوە، بە دڵنیاییەوە ڕابووە سەرپێیان و ڕێگای گەڕانەوەی گرت .

یەکەم جار لەسەر کەناری ڕووبارەکە ، توشی ماسیەکە هات ، کە زۆر بە حەسرەتەوە چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی وەڵامەکە بوو . شوانەکە ڕووی لە ماسیەکە کرد :

پیاو چاکەکە پێی گووتم ، تۆ دوڕێکی بەنرخی بچوك لە قورگت گیر بووە ، هەر یەکێك ئەو دوڕە دەربکات هەم بۆ خۆی هەم سامانێکی گەورەی دەست دەکەوێ ، هەم تۆش بەختت دەکرێتەوە و دەردەسەریت لە یەخە دەبێتەوە و بۆخۆت گەورە و گەورە دەبی .

ماسیەکە بە هەڵەداوان لە شوانەکە زۆرتر نزیك بویەوە و هاتە کەناری نزیك شوانەکە گوتی : کەواتە هەر خۆت وەرە ، ئەو دوڕە لە قورگم دەربێنە و بۆ خۆت ببە بەخاوەن ئەو سامانە گەورەو منیش ڕزگار بکە!

شوانەکە ئەوەندە بێ منەت بوو بەم وشانە وەڵامی دایەوە :

وازم لێ بێنە ، منیش خۆم بەختم کراوەتەوە . نەگبەتی شانی بەرداوم بۆ گوندەکەی خۆم دەگەڕێمەوە ، شوانی خۆم دەکەم و پێویستیم بە دوڕو گەوهەری قورگی تۆ نیە !

شوانە ئەمەی گوتو بە ڕێ کەوتەوە . تا گەیشتەوە لای پاشایەکە ، یەکسەر چووە دیوەخانی کۆشکی ئەو پاشا خەمگینە .

هەرکە پاشا چاوی پێ کەوت ، زۆر خۆشحاڵ بوو ، بەخێر هاتنەوەیەکی گەرمی لێ کرد و داوای وەڵامی لێ کرد .بەڵێ حەکیمی دانا ، کە لە خەوێ بە خزمەتی گەیشتم ، دەربارەی تۆ ووتی ، تۆ تەنیا کچێکی و جلوبەرگی پیاوانەت لەبەر کردووە بۆ شاردنەوەی

کچێتی خۆت ، خەم و بەختەوەر نەبونت ئەو دەمە دەرەوێتەوە کە بۆ خۆت مێرد بکەیت ، کورێك بە ئارەزوی دڵی خۆت دیاری بکەی ، چونکە مێرد کردن تاکە ڕێگای هەڵهێنانی ئاسۆیەکی پڕ لە خۆشی و ئاسودەیی تۆیە.

پاشا وەڵامی دایەوە : بەڕاستی تۆ مرۆڤێکی بوێری . زۆر سوپاس بۆ ئەو پیاو چاکە ، ڕاستە من کچێکی بێ چارەم ، بەڵام دەورو بەرەکەم ناچاری کردوم کە بەو ڕەنگە بژیم ! مادامەکی هەر خۆت بەو نهێنیە دەزانی و بۆت درکاند م هەر تۆ ئەو کەسەی دەمەوێ مێردی پێ بکەم ، شوانە هەر وا قی ورما ، دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوو ، کچە پاشا لەسەر گوتنەکەی بەردەوام بوو ، من هەر بەخۆم چەند سەرباز و چەك و جبەخانە بخوازی دەیخەمە بەردەستت و دەبێ هەندێك لە دووری شارەوە خۆت وەك بەگزادەیەك نیشان بدەی و داوای خوازبێنی من بکەی ، منیش لەبەر چاوی میللەت خۆم ئاشکرا ناکەم و دێمە مەیدانی ڕم بازی و تۆ لە من دەبەیتەوە و لەبەرچاوی خەڵکەکە ئاشکرام دەکەی و یەکسەر مێردت پێ دەکەم ، چونکە تاکە مەرجی من ئەوە دەبێ کە لە مەیدانی ڕمبازی لە من ببەیتەوە . ئیتر دەبینە ژن و مێردی یەکتری . من شاژن و تۆش پاشای شار . لێرەدا شوانە هەستایە سەر پێ و زۆر بە خێرایی گووتی :

نا هەرگیز من شتی لەم جۆرە ناکەم . من خۆم بەختم کراوەتەوە و گەرەکمە بگەڕێمەوە گوندەکەم و شوانی خۆم بکەم .شوانەکە لە شار دەرچوو ،ڕێگایەکەی بەلای ماڵی جوتیارەکە کەوتەوە . جوتیارەکە پێشوازیەکی گەرمی لێ کرد و لێی پرسی ، ئاخۆ بە ئامانج گەیشتوەو وەڵامەکی بۆ بەدبەختیەکانی ئەویش بەدەست هێناوە ؟

شوانە وەڵامی دایەوە : پیاو چاکەکە پێی گوتم " هۆی کەمی بەرهەمی زەویەکەت بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ، هەر چوار قوژبنی زەویەکەت پڕ لە گەنجینەیە، هەر شتێکی تۆ لەو زەویە دەچینی ، ڕەگ و ڕیشەی لەو زێڕ و گەنجینە نرخدارانە گیر دەبێ ، وەك پێویست نەش و نما ناکەن و هیچ هەرمێنێکیان نەبووە .

جوتیارەکە بە دۆزینەوەی ئەو هەموو گەنجینەیە گەلەك شادو بەختەوەر بوو ، بەشوانەکەی گووت وەرە پیاوی چاك بە ، لەگەڵ ئێمە ببە هاوبەش ، من ئەو کچە تاقانەی خۆمت پێشکەش دەکەم و لەو گەنجینەیەش نیوەیت دەدەمێ .

شوانە بە پێکەنینەوە : من خواستی شازادەیەکم بەلاوەناوە کە نموونەی شۆخ و شەنگی بوو ، هەر لە خۆرەتاو دەچوو ، لە گەڵ مانگی چواردە قۆشمەی بوو ، خۆی داوای لێ کردم

لە شوێنەکەی ئەو ببمە پاشا و خۆی شاژن ، هەموو سامانی خۆی بە من بەخشی ، کەچی ڕازی نەبووم ، ئیتر چۆن دەبمە زاوای تۆ و گەنجینەی تۆ قبوڵ دەکەم ؟! من دەگەڕێمەوە گوندەکەی خۆم و هەموو پلەو پایەو گەنجینەو ژن هێنانێکی لەم جۆرە بەلاوەدەنێم . چونکە بەختم کراوەتەوە ، لەوێ بەختەوەر دەبم " شوانە ئەو قسانەی کرد و ماڵئاوایی لە جوتیارەکە کردوو ڕێی خۆی گرت .

هەر لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بوو ، شوانە ڕێگای کەوتە لای دار چنارەکە ، کە هەر باریك و وشك و گەڵا زەرد بووەکەی جاران بوو . پاش بەدی کردنی یەکتری دار چنارەکە پرسی :

هێی شوانە ، هیوادارم لە سەفەرەکەت سەرکەوتوو بووبیت ، بەڵام پێم نالێی وەڵامی دەردی من چی بوو؟

شوانە وەڵامی دایەوە :

بەڵێ پیاو چاکەکە پێی گوتم ، تۆش بەختت کراوەتەوە ، بەڵام دەبێ لەپێشەوە بەوە بزانی کە ڕەگو ڕیشەکانی تۆش گەیشتۆتە سەر چەندان کوپەڵە زێڕ و زیوو ، هەر بۆیەش لق و پۆپەکانت بەرەو ووشك بوون و گەڵاکانت زەرد هەڵگەراون .کە هۆی نەگبەتیەکانی تۆن . دار چنارەکە بە لالانەوە بە شوانەی گوت :

کەواتە پیاوێکی ژیربە ، هۆ شوانە لەسەر فرسەت پاز مەدە ، مەردی خوابە وەرە زەویەکەی ژێرم هەڵکۆڵە ، ئەو هەموو زێڕ و زیوە هەر شایستەی تۆیە ، تاکو تۆ بە ئاسودەیی بژی و منیش لەمەودوا بەختەوەر بم . شوانە بزەیەکی هاتێ و بە دارەکەی گوت :

داری گەمژەڵ ! دیارە تۆ زۆر نەفامی ! بۆ نازانی من کورسی پاشایەتی و شاژنێکی جوان و نازدارم ڕەت کردۆتەوە . دوری نرخداری قورگی ماسیەکم گەرەك نەبوو . گەنجینەی بێشوماری زەوی جوتیارەکەم بە نەگەڕانەوەی گوندەکەم نەگۆڕیوەتەوە ، ئیتر چۆن دەست بۆ زەوی ژێر تۆ دەبەم .شوانە ئەو قسانەی کردو بەبێ ماڵئاوایی کردن لە دارەکە ، ملی ڕێگای چارەنووسی خۆی گرتەوە ، ئەو چارەنوسەی کە گورگی لەڕ و برسی چاوەڕوانی بوو .

شوانە لە ڕێگای خۆیدا ، بۆ دواجار گەیشتەوە هەواری گورگە لەڕەکە . گورگی برسی زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کرد ، شوانەش ماندو و مردی . هێزی زیاتر ڕۆیشتنی لەبەردا نەمابوو . بە نیازی حەسانەوە لەبەردەم گورگە دانیشت و سەربردەکانی خۆی بۆ گورگە گێڕایەوە . شوانە بۆ گورگەی گێڕایەوە ، کە پیاو چاکەکە سەبارەت بە پرسیارەکەی ئەویش

گوتویە : تاکە دەرمانی چاکبوونەوەی گورگی لەڕ ، هەر تەنیا خواردنی گۆشتی پیاوی گێلە . گورگە بە تەواوی گوێبیستی ئەو هەموو بەسەر هات و فرسەتانە بوو کە شوانە بە سەریدا پێ پەریبوو ، چاوی چووە پشتی سەری و، ئەوەندەی تاقەتی تیا مابوو ، رووی لە شوانە کرد کە بەڕاستی شوانە بە چاوی خۆی باوەڕی نەکرد !

- بەڕاستی تۆ ئەو جۆرە پیاوە گێلەی کە پیاو چاکەکە گۆشتەکەی بۆ من کردۆتە دەرمانی چابونەوەم .

ئیتر گورگە کەوتە سەرو گێلاکی شوانەی هیلاك و ماندوو ، بەبێ ئەوەی توانای دەستکردنەوەی بە بەرەوە مابێت ، بووە خواردەی گورگی لەڕ و گورگە بۆ خۆی چابۆوە .

سەرنج : ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری ( التراث الشعبي ) ی عێراقی ژمارە ( ١٥ ) ەی ساڵی ١٩٧١ لە ئامادە کردنی کۆچکردوو " محمد تۆفیق وەردی" بە زمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە

